# نوێژ لەدوای کێوە بکەم؟

## پاڵپشت بە مەنهەجی خیر القرون

نوسین و لێکۆڵینەوەی
لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

# نوێژ لەدوای کێوە بکەم؟

## پاڵپشت بە مەنهەجی خیرالقرون

نوسین و لێکۆڵینەوەی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

ئامادەکردنی

نوری ڕێ

١٤٤٢ی کۆچی/٢٠٢٠ زاینی



## پێشەکی

**الحمدلله له مافي السموات ومافي الأرض وصلى الله على نبينا سيد المرسلين وخاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم وعلى آل وأصحابى أما بعد...**

سەرەتا دەمەوێت ئەوە بزانن کە نوسیوومە عەقیدە چونکە ئەم بابەتە پەیوەستە بەعەقیدەوە. هەروەها لە کتێب و ڕەسائیل و ئصوڵە عەقیدەییەکانی سەلەف باسکراوە، بۆیە تایبەتە بە عەقیدە. ئەوەی گرنگە هەرشتێک پەیوەندی بەعەقیدەوە هەبێت دەبێت زۆر بەووردی و هەستیارییەوە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و زۆریش بەهەند وەربگیرێت.

نوێژ یەکێکە لەڕووکنەکانی ئیسلام دوای شەهادەت هێنان و دانونان بە تەوحیددا، نوێژ ئیعتیقاد و عەمەلە. دەبێت بەکردەوە بیسەلمێنێت کەوا نوێژکەریت، هیچ بیانوویەک نییە بەوەی زۆر مەلا و داعی جاهیل بەکاریدەهێنن و، دەڵێن بڕوای پێ هەیە بەڵام بەهۆی تەمبەڵییەوە نایکات. زۆر چاکە، بۆئەمەش پێیان دەڵێم رسول الله (ﷺ) دەفەرموویێت: أثقل صلاة على المنافقين عشاء والصبح. نوێژی عیشا و بەیانیان زۆر گرانە

لەسەر مونافیق. کەواتە بەهۆی دوو نوێژ دەبێتە مونافیق، ئەی ئەگەر هەر نەیکات ئەوە ئەولاترە بۆ کوفر.

ئەو باسەی ئێمە لەسەری دەڕۆین بریتیە لە نوێژ لەدوای کێ بکەم؟ ئەمە پرسیاری زۆرینەی زۆری زانا و پێشەواکانی سەلەف و خیر القرون بووە لەمامۆستاکانیان. بەڵام ئەمرۆ ئەم شتە لای چینێکی زۆر کەم نەبێت، ئەم پرسیارە هەر وجوودی نەماوە چونکە نوێژ مەرجی تایبەتی خۆی هەیە. یەکێک لەوانە ئەگەر ئیمامت کافر و موبتەدیع بێت نوێژی لێوەرناگیرێت و، دەبێت نوێژەکە دووبارە بکرێتەوە. پشتیوان بە الله لەسەر ئەم باسە بەپشت بەستن بەکتێبەکانی زانایانی سەلەف، زۆرترین ئەثەر و قەولی زانایانی سەلەفی لەسەر باسدەکەین. ئنجا دواتر دەچینە سەر دەق -نص- و تەفسیر، بۆئەوەی بزانین نوێژ لەکوێ بکەین.

## بەشی یەکەم: نوێژ لەدوای کێوە بکەم؟

ئەم زنجیرەیە دابەشی دوو بەشی دەکەم:

یەکەمیان: نوێژ لەدوای کێوە بکەم؟

دووەمیان: نوێژ لەکوێ بکەم؟

ئەم باسە زۆر گرنگە هەروەها گرنگی زۆریشی پێدراوە لەلایەن سەلەفەوە. سەیربکەن لەهەموو کتێب و نامیلکە عەقیدەییەکانیان ئەم شتەیان باسکردووە و فەرامۆشیان نەکردووە. ناچینە سەر ناوەڕۆکی نوێژ و حوکمی نوێژنەکەر و چەندی و چۆنیەتی، چونکە پەیوەست نییە بەزنجیرەکەمانەوە. تەنیا بەکورتی یەکەم عەمەل لەدوای شەهادەتهێنان و تەوحیدەوە، نوێژە. سەیربکەن لەهەموو فەرموودەکانی ئەرکانی ئیمان لە صحیح و سنن و مسند و مصنف و مستدرك و معجمەکان دا هاتووە. یەکەم کردەوە کە موسڵمان ئەنجامی بدات (نوێژ)ە. بەڵام لەهەموویاندا ڕۆژوو یان حەج نەهاتووە، گەرچی فەرز و واجبان. ئەمەش دەلالەت و ئاماژەیە لەگەورەیی نوێژ، هەربۆیەش نەکردنی بەئیجماع کوفرە. هەروەک هاوەڵی بەڕێز "أنس بن مالك" دەفەرمووێت: نوێژ هیچ کەفارەتێکی نییە و دەبێت هەر بیکەیت. هەروەک لەفەرموودەکاندا بۆمان هاتووە رسول الله نوێژی بە دانیشتنانەوە کردووە بەهۆی شکانی قاچییەوە[١]. تەنانەت هەرکاتێک لەخەو هەڵستایت دەبێت بیکەیت، هەروەک بۆمان وارد بووە لە صەحیحی بوخاری و موسلیم و سونەنی ئەبی داود دا کەوا رسول الله لە گەشتادا بوون، لە یەکێک لە دۆڵەکان

---

(١) (بخاری، مسلم).

لایانداوه کە شەو بوو، بۆ پشوودان. بیلال بن رباحیان وەک پاسەوان دیاریکردوە، تاوەکو بەئاگایان بهێنیت بۆ ئەنجامدانی نوێژ. بەڵام ئەویش خەو دەیباتەوە، بۆیە بەیانی بەگەرمای تیشکی خۆر هەڵدەستن کە هەڵدەستن بانگ دەدرێت و دەستنوێژ لەشوێنیکی تر دەشۆن و نوێژ دەکەن.

بۆیە ئەگەر لەشساغ بیت، دەبێت بەپێوە بیکەیت، ئەگەرنا بەدانیشتنەوە، ئەگەرنا بەپاڵکەوتنەوە، ئەگەرنا بەئیشارەی دەست و چاو سەر جوڵاندن، ئەگەرنا بەئیشارەی چاو ئەنجامی بدەیت.

ئەمە تەنیا پوختەیەکی کورت بوو لەسەر گرنگی و گەورەیی نوێژ.

**یەکەم: نوێژ لەدوای کێوە بکەم؟ نوێژی لەدوای چی پێشەوایەکەوە جائیزە؟**

لێرە پشتیوان بە الله باسی نامیلکە و ئصولە عەقیدەییەکانی سەلەف لەسەر ئەم باسە دەکەین.

١. پێشەوا سفیان الثوری.

ئیعتیقادی پێشەوا سفیان کاتێک ئامۆژگاری "شعیب بن حرب" دەکاتن، لەکۆتاییدا بەمشێوەیە دەڵێت: ئەی "شعیب بن حرب" ئەم شتەی دەینوسیت هیچ سوودت پێناگەیەنێت، هەتاکو نوێژ لەدوای هەموو

چاکەکار و گوناهکارێک بەڕاست نەبینیت. شعیب دەڵێت: پێمان گوت ئەی باوکی عبدالله، ئایا هەموو نوێژەکان؟ فەرمووی پێمان: نەخێر، تەنیا نوێژەکانی هەینی و جەژنەکان نەبێت. بەڵام بۆ نوێژەکانی تر تۆ ئازادی نوێژ مەکە لەدوای هیچ یەکێکیان، هەتا متمانەی پێ دەکەیت و چاک دڵنیابووی کە ئەهلی سوننە و جماعەیە[1].

سەیربکەن (بر أو فاجر) مەبەستیان پێشەوا و ئیمامێکی موسڵمانە ئنجا چاکەکار بێت یان گوناهکار.

٢. لە ئصول السنەی ئیمام ئەحمەد دا.

بەمشێوەیە ئیمامی ئەحمەد باسی دەکاتن: واجبە گوێڕایەڵی و ملکەچبوون بۆ ئەمیر و پێشەوا و ئەوانەی کەوا دەبنە خەلیفە و بیعەتیان پێدەدرێت و خەڵک لەدەوریان کۆدەبێتەوە (واتە خەلیفەی شەرعی). ئنجا چاکەکار بێت یان خراپەکار، نوێژکردنی هەینی دەبێت لەدوایانەوە بکرێت. ئیتر باشبن یان خەراپ، دەبێت دوو ڕکعاتی تەواو بکرێت. هەرکەسێک دووبارەی بکاتەوە ئەوا موبتەدیعە و، لە سوننەتیشە نوێژ

(١) ئەمە لە شرح اصول اعتقاد اهل السنە والجماعەی أبو القاسم ألالکائی واردە.

لەدوای پێشەوای موسڵمان بکرێت. ئنجا چاکەکار بێت یان گوناهکار بێت.

ئەمە لە سوننەی ئیمامی ئەحمەد واردە بەڵام من هەندێک بەپوختی و کورتی نەقڵم کردووە. کەواتە ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: پێشەوا و ئەمیری موسڵمان بێت جا چاکەکار بێت یان گوناهکار بێت. ووریابن، ناڵێت موبتەدیع یان کافر، چونکە لەشوێنی تر دێینە سەر قەولەکانی، سەبارەت بە جەهمی و قەدەرییەکان.

٣. لە شەرحی سوننەی المزنی کە یەکێکە لەقوتابییە زانا و گەورەکانی ئیمامی شافعی یە رحمه الله بەمشێوەیە بۆمان باس دەکاتن:

سەرەتای باب بەناونیشانی (الصلاة وراء أئمة والجهاد معهم والحج). ئنجا لە ژمارە (١٨)دا بەمشێوەیە لەسەری دەدوێت و نابێت واز لەئامادەبوونی نوێژی هەینی بهێنرێت. هەروەها نوێژیش لەگەڵ چاکەی ئەم ئوممەتە و خەراپەکەی پێویستە مادام هیچ بیدعەیەکی نییە، چونکە موبتەدیع گومڕایە و نوێژ لە دوای دروست نییە و ناکرێت. انتهی. سەیربکەن دەڵێت: ئەمیری موسڵمان، ئنجا چاکەکار بێت یان گوناهی هەبێت. نەک موبتەدیع و کافر، ووریابن.

بۆئەوەی باسەکە زۆر درێژ نەبێتەوە، لەبەشەکانی تر دێینە سەر دانە بەدانەی ئەقوالی زانایانی سەلەف، لەسەر نوێژ لەدوای چینەکانی وەک موبتەدیع و جەهمی و قەدەری و مورجیئی و هاوشێوەکانیان بەراورد کردنیان بەئێستا. والله تعالی اعلی واعلم.

## بەشی دووەم: هەندێک لە ئەثەری خیر القرون لەسەر نوێژ لەدوای هەریەک لە جەهمییە و قەدەرییە و موعتەزیلە و مورجیئە.

زانینی مەوقیفی سەلەف لەسەر ئەم باسە دەبێتە هۆی ڕوونتربوونی تێگەیشتن لەم زنجیرەیە، گەرچی زۆرێک هەن نازانن جەهمییە و قەدەرییە و مورجیئە و موعتەزیلە کێن و کێ بوون. بەڵام بەکورتی ئەمانە چەند فیرقەیەک بوون، هەریەکە و لەکات و ساتی جیاواز سەریان هەڵداوە، بۆنمونە جەهمییەت لەلایەن "جعد بن درهم" و دواتریش "جهم بن صفوان" بڵاوەی پێکرد کەوا بەشێک پێیان وایە ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ "لبیدی ساحیری" جولەکە. جەهمییەکان بەقورئانی کەلامی اللەیان دەگووت: دروست کراوە، واتە مەخلوقە. هەروەها ڕەفزی چەندان ئایەت و حەدیثی بینین و بڵندبوونەوە و سیفاتیان دەکرد. هەرچی قەدەرییەش بوو ئەمانەش لەلایەن "معبد الجهنی" و "غیلان"،

پەرەیان پێ دەدرا. نەفی بەشێک لەقەدەریان دەکرد و دەیان گووت: الله عیلمی بەهەموو شت نەبووە، هەروەها خێر و شەڕیش بۆ هێز و دەسەڵاتی الله ناگەڕێننەوە. بۆیە ئەمانە لەلایەن زانا و پێشەوایانی سەلەف و خیرالقرون زۆر بەتوندی وەڵام دراونەتەوە و دەیان نامیلکە و کتێبیان لەسەر نوسیون. هەروەها یەکێک لەو باسانەش پرسی نوێژکردن بوو لەدوایانەوە چونکە قوتابیەکان پرسیاریان ئاڕاستەی شێخەکانیان دەکرد بەم شێوەی خوارەوە:

له "السويدي"ـوە دەڵێت: پرسیارم لە وكيع بن جراح کرد لەسەر نوێژ لەدوای جەهمییەت؟ فەرمووی: نوێژ لەدوایانەوە ناکرێتن(١).

فطر بن حماد بن أبي عمر الصفار دەڵێت: پرسیارم لە معتمر بن سليمان کرد و، پێم گووت: ئەی باوکی محمد ئیمامێک هەیە دەڵێت: قورئان مەخلوقە. ئایا نوێژ لەدوایەوە بکەین؟ پێی گووتین: پێویستە لەملی بدرێت. ئنجا دەڵێت: پرسیارم لە حماد بن زيد کرد، پێم گووت: ئەی باوکی ئیسماعیل ئیمامێکمان هەیە دەڵێت: قورئان مەخلوقە. ئایا نوێژی لەدواوە بکەین؟ گوتی: نوێژ لەدوای موسڵمانێکەوە بکەن، لەوەم پێخۆشترە.

(١) السنة لعبدالله بن أحمد.

هەروەها فطر دەڵێت: پرسیارم لە یزید بن زریغ کرد و، پێم گووت: ئەی باوکی معاویە ئیمامێکمان هەیە و، دەڵێت: قورئان مەخلوقە، نوێژی لەدواوە دەکرێت؟ فەرمووی: نەخێر هیچ ڕێزێکیشی نییە.

إسحاق بن بهلول دەڵێت: بە یزید بن هارون ـــ م گووت: ئایا نوێژ لەدوای جەهمییەوە بکەین؟ فەرمووی: نەخێر. پێم گووت: نوێژ لەدوای مورجیئە بکەین؟ فەرمووی: ئەوانە بەڕاستی پیسن.

زهير بن البابي دەیفەرموو: ئەگەر بۆی دەرکەوت کەوا ئەو کەسە جەهمییە، ئەوا نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە ئنجا جومعە بێتن یان نا.

٨٣٣ - سمعت أبي ﵀ يقول: لا يصلى خلف القدرية والمعتزلة والجهمية.

هەروەها عبداللّٰەی کوڕی ئیمام ئەحمەد دەڵێت: گوێم لەباوکم بوو دەیگووت: نوێژ ناکرێتن لەدوای قەدەرییە و موعتەزیلە و جەهمییە.

معاذ بن معاذ قال: صليت خلف رجل من بني سعد، ثم بلغني أنه قدري، فأعدت الصلاة بعد أربعين سنة، أو ثلاثين سنة.

معاذ بن معاذ دەڵێت: نوێژم لەدوای یەکێک کرد لەپیاوانی بنی سعد، دواتر پێیان ڕاگەیاندم کەوا قەدەری بوو. نوێژەکەم دووبارە کردەوە، دوای چل ساڵ یان سی ساڵ[١].

هەروەها ئیمامی بخاری لە خلق الأفعال العباد دا دەڵێت: نوێژ لەدوای جەهمی و ڕافیزی بکەم، وەک ئەوەیە لام لەدوای جولەکە و گاورەوە بیکەم. هەروەها سەلامیان لێناکەین و یارمەتیان نادەین و زەواجیشیان لەگەڵ ناکەین و سەربڕاوەکانیشیان ناخۆین.

لەم بارەیەوە ئەقوالی زانایانی سەلەف گەلێک زۆرە. وەک ڕوونیشە، ئەوکاتە ئەو گرووپانە زیاتر کاریگەریان هەبوو و باوبوون و ناویان هەبوو. بۆیە ئەوانیش زیاتر قسەیان لەسەر ئەوان کردووە. ئەوەی دەمەوێت تیشکی بخەنە سەر ئەوەیە کەوا ئەو گرووپانەی ناومان هێنان، زانایانی سەلەف و نوێژیان لەدواوە بەدروست نەزانیوون. هەموویان خۆیان دابووە پاڵ ئیسلام و وەک ئەوان نوێژیان دەکرد و ئیمام بوون و وتاریان پێشکەش دەکرد. تەنانەت ئەوانەی ئەمڕۆ بۆنمونە مەلایەک یان ئیمامێک سەر بە ڕەوتێکی عیلمانی یان مارکسی یان دیموکراسی بێت، زۆر خەراپترە لە جەهمی و قەدەری و مورجیئی و موعتەزیلی. بۆیە

---

(١) ئەمانە هەمووی لەکتابی سنەی عبدالله بن أحمد وارده و سەنەدیشیان تەواوە.

ئەگەر نوێژ لەدوای ئەوان نەکرابێت و جائیز نەبوو بێت، ئەوا لەدوای ئەوانەی ئەمڕۆ هەر ناکرێت، واللە أعلم.

لەبەشەکانی داهاتوو قسە لەسەر ئەوە دەکەین لەکوێ نوێژ بکەین، بەپێی بەڵگەی قورئان و حەدیث.

## بەشی سێیەم: چی شوێنێک نوێژی تێدا دەکرێت؟

**دووەم: نوێژ لەکوێ بکەم؟ نوێژ لە چی جێگایەکدا دروستە؟**

پێویستە بزانین ئێمە دەتوانین لەچی شوێن و جێگایەکدا نوێژ بکەین و، چی شوێن و جێگایەکیش نوێژی تێدا نایەت. پشتیوان بە اللە بە ئایەت و حەدیث وەڵامەکەی دەدەینەوە.

أُعْطِيتُ خَمْسًا لم يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ من أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لي الْمَغَانِمُ ولم تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وكان النبي يُبْعَثُ إلى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثْتُ إلى الناس.

رسول اللە (ﷺ) دەفەرموێت: پێنج شتم پێدراوە کە نەدراوە بەهیچ کەس لەپێش خۆمدا. ئەوانیش سەرکەوتنم پێبەخشراوە، بەترس خستنە دڵی دوژمن لەدووری یەک مانگ ڕێوە و، زەویشم بۆ پاککراوەتەوە و پێم دراوە و بۆم کراوەتە مزگەوت، هەرکەسێک لە ئوممەتەکەم گەیشت بە

نوێژ با نوێژی تێدا بکات. هەروەها غەنیمەتیشم بۆ حەڵاڵ کراوە کە بۆ هیچ کەسێک پێش خۆم حەڵاڵ نەبووە. هەروەها شەفاعەتیشم پێ بەخشراوە و، هەر پێغەمبەرێک تایبەت بۆ گەلەکەی خۆی نێردراوە بەڵام من بۆ هەموو خەڵکی نێردراوم[(١)].

کەواتە هەموو شوێنێکی پاک نوێژی تێدا دەکرێت. ئنجا مزگەوت بێت یان هەر شوێنی تر بێت تەنیا جێگای پیس نەبێت. بەڵام گەلانی پێش تر بۆیان نەبوو نوێژ لەهەموو شوێن بکەن تەنیا پەرستگا و کەنیسەکانیان نەبێت. هەموو شوێنێک لەسەر زەوی پاک بێت بۆ موسڵمان جائیزە نوێژی تێدا بکات. یەکێک لەو شوێنە پاکانەش مزگەوتە، مزگەوت جێگای تایبەت و پیرۆزە تەنها بەعیبادەت کردن. بۆنمونە الله عزوجل لەقورئان لەسورەتی جن دا دەفەرموویت: ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ١٨﴾.

واتە مزگەوتەکان تایبەت کراوە بۆ عیبادەت و پەرستنی الله. هەریەک لە موفەسیرانی وەک:

- تفسیری طبری

(١) حەدیثی صەحیح، ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

- تفسیری البغوی
- تفسیری قرطبی
- تفسیری إبن کثیر

لەسەر ئەم ئایەتە دەڵێن: واتە تەوحید و یەکخواپەرستی. هەروەها دەڵێن: کاتی خۆی جولەکە و گاور کاتێک دەچوونە ناو پەرستگا و کەنیسەکانیان، هاوبەشیان بۆ الله عز وجل بڕیاردەدا. بۆیە الله فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کرد کەوا یەکخواپەرستی تێدا جێبەجێ بکات بێ هیچ شیرکێک. هەروەها ئەثەری سعید بن جبیریش لە إبن عباسەوە دێننەوە، بەوەی مەبەست ئەندامەکانە وەک لووت و نێو چاوان و دەست و پێیەکان. کما قال الرسول: أمرت أن أسجد علی سبع أعضاء... کەواتە هەر مزگەوتێک ئەو مەرجەی تێدا نەبێت پاکی لەدەست دەدات. ئەگەر بێتو ئەم ئایەتە جێبەجێ بکەین، زۆر دەگمەن مزگەوت دەردەچن لەم فلتەرە.

لە بەشەکانی دیکەدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە کەوا چی جۆرە مزگەوتێک نوێژی تێدا ناکرێت پشتیوان بە الله.

## بەشی چوارەم: ئەو مزگەوتانەی نوێژی تێدا ناکرێت.

لەبەشی ڕابردوو باسی مزگەوتمان کرد دەبێت چی مەرجێکی تێدا بێت، چونکە مزگەوت یەکێکە لەشوێنە پیرۆزەکانی عیبادەت کردن و کۆبوونەوەی نوێژەکانی هەینی و نوێژی جەژنەکان تێیدا. ئەو مزگەوتانەی نوێژ تیاندا بەهیچ جۆرێک ناکرێت چییە و چۆنە و لەلایەن کێوە دروست دەکرێت؟

الله عزوجل لەقورئاندا لەسورەتی براءة التوبه دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٠٧﴾.

لەتەفسیری ئیمامی طبری چەند قەولێکی هێناوە لە إبن عباس و لە سعید بن جبیر و لە مجاهد و لە ضحاك و لە عکرمەوە، واتە موفەسیرانی سەلەف. هەروەها لە تەفسیری إبن کثیر هەمووی جەمع کردووە بەوەی هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بەم شێوەیە بووە:

لە مەدینە پێش هیجرەت پیاوێکی لێ بوو بەناوی ئەبو عامری ڕاهب کە خەزرەجی بوو ئەو کەسە. عیلمی ئەهلی کتابی دەخوێند و ڕێز و پلەوپایەیەکی دیاری هەبوو لەنێو خەزرەجدا. بۆیە کاتێک رسول الله

کۆچی بۆ مەدینە کرد و خەڵکیش لەدەوری کۆبوونەوە و ئیسلام بڵند بووەوە، هەروەها الله عز وجل سەرکەوتنی بەدری بەموسڵمانان بەخشی، بەمەش ئەبو عامر دوژمنایەتی زیاتر بوو. زیاتر ڕقی بەرامبەریان هەڵگرت، تا وای لێهات ڕای کرد بەرەو مەککە بۆ نێو موشریکان تاوەکو دوژمنایەتیان بکات و دوژمن لەدەوریان کۆبکاتەوە. تەنانەت لەجەنگی ئوحد دا ئەو کافر و فاسقە هەستا هەندێک چاڵی هەڵکەند لەنێو ڕیزەکان، تاوەکو وای لێهات رسول الله کەوتە نێو یەکێک لەو چاڵانە و بەسەختی بریندار بوو. ئنجا ئەم شتە مەشهورە لەلایەن زانایانی سیرەی نبوی. پێش ئەوەی ڕابکات رسول الله دەعوەی لەگەڵ کرد و قورئانی بەسەردا خوێند بۆئەوەی موسڵمان بێت، بەڵام پشتی تێکرد.

دوای ئەوەی ئەبو عامری ڕاهب شەڕی ئوحدی بینی و زانی چی شتێک لەئارادایە، ئنجا ڕایکردە ڕۆم و لای هەرقڵ. دواتر نامەی نارد بۆ ئەنصار، ئەوانەی مونافیق بوون و فاسیق بوون، داوای لێکردن کەوا ئەو یارمەتیان دەدات و بەسووپایەکی زۆرەوە دێت لەلایەن ڕۆمەوە تاوەکو محمد و هاوەڵانی دەربکات. بۆیە داوایان لێدەکات بەوەی جێگا و شوێنێکی بۆ دروست بکەن بەمەبەستی کار و پیلانەکانی. ئەمانیش وا ڕێکدەکەون کەوا مزگەوتێک دروست بکەن موقابیل بە مزگەوتی قباء.

ئەمەش پێش ئەوەی رسول الله دەربچێت بەرەو جەنگی تبوك، پێش دەرچوون مزگەوتەکە تەواو دەکەن، بۆیە مونافیقەکان دێن و داوا دەکەن کەوا پێغەمبەر نوێژی تێدا بکات بۆئەوەی خەڵک بەو هۆیەوە ڕووی تێبکەن. هۆکاری ئەوەیان بۆ دروست کردنی ئەو مزگەوتە خستەڕوو، بەوەی بۆ لاوازەکان و ئەوانەی بە شەو ناتوانن بچن بۆ مزگەوتی رسول الله. بەڵام رسول الله (ﷺ) فەرمووی: ئێمە ئێستا مەشغوڵی دەرچوونین بەرەو تبوك، کاتێک گەڕاینەوە دێینەوە و نوێژی تێدا ئەنجام دەدەین. دوای ئەوەی لە تبوك گەڕانەوە دووری نێوانیان، واتە ئەو و مزگەوتەکە تەنیا یەک شەو و ڕۆژ بوو، وەحی دابەزی و هەواڵی مزگەوتی ضرار واتە (مسجد ضرار)ی بە رسول الله گەیاند و ئامانج و نیەتیان چییە و بۆ چییە و لەلایەن کێوە دروست کراوە. ئامانجیان بۆ دروستکردنی دژایەتی و تەفرەقەی نێوان ئیماندارانە لەنێو مزگەوتی قباء لەگەڵ ئەو مزگەوتەدا چونکە مزگەوتی قباء {أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ}. بەڵام مسجد ضرار (ارصاد و تفريق)ـی نێوان ئیمانداران بوو، بۆیە رسول الله فەرمان دەکات بە مالك بن دخشم و معن بن عدی کەوا: (**انطلقا إلى هذا المسجد الظالم أهله، فاهدماه وحرقاه**). بچن بەرەو ڕووی ئەو مزگەوتەی خەڵکەکەی ستەمکارن، تێکی بدەن و بیروخێنن و بیسووتێنن، پێش

ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ مەدینە. بۆیە ئەوانیش بە پارچە ئاگرێکەوە دەچن دەیڕوخێنن و دەیسووتێنن، ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی: {وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا ...}. ئەوانەی ئەو مزگەوتەیان دروست کرد دوانزە کەس بوون. موفەسیران ناوەکانیشیان هێناون ئی هەموویان، بەڵام من نەقڵی ناکەم[1]. ئنجا ئەوان کە مزگەوتەکەیان بیناکرد سوێندیان دەخوارد بەوەی {وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ}. ئامانج و نیەتیان تەنیا چاکە و خێرە، بەڵام الله عز وجل فەرمووی: {وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ}. شاهێدی ئەوەبوو کە ئەوان درۆ دەکەن و ڕاست ناکەن.

دوای ڕونبوونەوەی حاڵی (مسجد ضرار)، الله عز وجل فەرمان دەکات بەوەی قال الله تعالی: {لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ}. هەرگیز نوێژی تێدا نەکەیت چونکە {لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ}. بناغە و بینای مزگەوت لەسەر ئەساسی تەقوا و عیبادەت و یەکخواپەرستی بووە کە مەبەست مزگەوتی پێغەمبەرە (ﷺ). کما قال المفسرون القرآن: {فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ١٠٨}.

---

(١) ئەمە هەمووی لە تەفسیری إبن کثیر دا هاتووە.

کەواتە ئەو مزگەوتانەی لەسەر ئەساسی دوژمنایەتی و دژایەتی ئەهلی ئیمان و ئیسلام دروست دەکرێت، ناکرێت و نابێت نوێژی تێدا بکرێت. ئەوان مونافیق بوون و نیەتیان بەچاکە و باشەش پیشاندا، بەڵام بەهۆی وەحییەوە کەشف کران. ئێستا زۆرینەی مزگەوتەکان بەئاشکرا و بێ پەردە دژایەتی ئەهلی تەوحیدی تێدا دەکرێت. هەموو مزگەوتەکان لەلایەن ئەوقافەوە حوکمی لێدەکرێت و مەلا و کەسی تێدا دادەنرێت، ئەوەی بەدڵیان بێت مزگەوت و مینبەری پێدەدەن، ئەگەرنا فڕێی دەدەن و دەری دەکەن. هەروەها ئەوەش دەزانین ئەوقاف هەمان حوکمی ابو عامری ڕاهبی هەیە، چونکە دژایەتی توندی ئیسلام و موسڵمان دەکات، بۆیە زۆرینەی زۆری مزگەتەکان هەمان حوکمی (مسجد ضراری) هەیە و نوێژ تێیدا ناکرێتن. واللە تعالی أعلی وأعلم.

## بەشی پێنجەم: یەکێک لەنیشانەکان موسڵمان لەمزگەوتەکان نامێنن.

دوای ئەوەی لەبەشەکانی پێشوو بەپێی قورئان و تەفسیر و حەدیث و ئەثەری سەلەف و خیر القرون ڕوونمان کردەوە دەبێت لەکوێ و لەدوای کێوە نوێژ بکرێت، بۆیە ئنجا دەچینە خزمەت زانستی نیشانەکان و فتن و

ملاحم چونکە ئێمە ئەمڕۆ لەسەردەمی فیتنەداین. لەهەمووکات زیاتر پێویستمان بەوەیە بگەڕێینەوە بۆ ئەو لایەنە.

لەسەر مزگەوت و نوێژی جومعە: حَدَّثَنِي أَبُو صَالِحٍ، قَالَ: ثنا أَبُو الْأَحْوَصِ، قَالَ: ثنا أَبُو حُذَيْفَةَ، قَالَ: ثنا سُفْيَانُ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ قَيْسِ بْنِ السَّكَنِ، عَنْ حُذَيْفَةَ، قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَوْ رَمَيْتَ بِسَهْمٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ لَمْ يُصِبْ إِلَّا كَافِرًا أَوْ مُنَافِقًا.

لە حذيفة بن اليمان ـەوە دەفەرمووێت: سەردەمێک دێت بەسەر خەڵکیدا ئەگەر بەکەوان تیر بهاوێژیت لەڕۆژی جومعەدا، ئەوا یان بەر کافر یان مونافیقێک دەکەوێت.

ئەم ئەثەرە حوکمی مەرفوعی هەیە چونکە غەیبییە. هیچ هاوەڵێک غەیبیان نەزانیووە، بۆیە دەدرێتە پاڵ رسول اللهوە، والله اعلم.

هەروەها هاتووە لەمستدرك على صحيحين كتاب الفتن وملاحم: أخبرنا أبو عبد الله الصفار، ثنا محمد بن إبراهيم بن أرومة، ثنا الحسين بن حفص، ثنا سفيان، عن الأعمش، عن خيثمة، عن عبد الله بن عمرو

(ﭭ) ، قال: يأتي على الناس زمان يجتمعون في المساجد ليس فيهم مؤمن[١].

واته لە عبدالله بن عمرو (ﭭ) دەڵێت: زەمانێک دێت بەسەر خەڵکیدا کۆدەبنەوە لە مزگەوتەکاندا هیچ ئیمانداریکیان تێدا نییە.

لەڕیوایەتێکی تردا بەم شێوە هاتووە: عن عبد الله بن عمرو أنه قال: لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَجْتَمِعُونَ {ويصلون} فِي الْمَسَاجِدِ وَمَا فِيهِمْ مُؤْمِن.

واته کۆدەبنەوە و نوێژیش دەکەن لەمزگەوتەکان، بەڵام هیچ ئیمانداریکیان تێدا نییە.

ئەمەشیان حوکمی مەرفوع وەردەگرێت چونکە غەیبییە و تایبەتە بەوەحی. سەنەدەکانیشان صەحیحە، واللە اعلم.

هەروەها ئەم باسە بەیەکێک لە نیشانە بچووکەکانی قیامەت دادەنرێت، واته کۆبوونەوەی خەڵک لەڕۆژی هەینیدا و نوێژکردن تێیدا بەیەکێک لەنیشانەکانی قیامەت هەژمار دەکرێت و، لەکتێبەکانی علوم أشراط

---

(١) هذا حديث صحيح الإسناد على شرط الشيخين، ولم يخرجاه.

ساعة و فتن و ملاحم دا باسکراوە. هەروەها ئەم باسە چونکە غەیبییە و تایبەتە بە نیشانەکان، بۆیە موحەدیثان لەکتێبەکانی فتن و ملاحم باسیان کردووە. ئەوەی گرنگە و ئێوە بیزانن ئەوەیە ئەم فەرموودەیە زۆر مەترسیدارە، چونکە ئەوانەی دەچنە مزگەوت و جومعە و جەماعەت دەکەن، هەر هەموویان خۆیان بەموسڵمان و ئەهلی ئیسلام دەزانن و خۆشیان دەدەنە پاڵ موسڵمانانەوە. چونکە بەحساب ئەوەی نوێژ دەکات موسڵمانە و لەبازنەی ئیسلامدایە، بەڵام وەک گووتم ئەم باسانە تایبەتن. تایبەتن بە ڕۆژگاری فیتنە و نزیکبوونەوەی قیامەت. بۆچی من ئەوەم باس کرد ئایا ڕوویداوە؟

لەوەڵامی ئەوەدا دەڵێم: ئەوەی کەمێک شارەزای دین و فتن و ملاحم و نیشانەکان و واقع بێت، ئەوەی بۆ دەردەچێت کەوا نیشانەکانی قیامەت، لەنێویاندا نیشانە بچووکەکان زۆرینەی زۆری ڕوویداوە. هیچ کەسێک ناتوانێت ئینکاری لەوە بکات. تەنانەت ئەو نیشانانەی کە ڕوویان نەداوە، چەند نیشانەیەکی دیار و کەمن وەک هاتنی مەهدی و ڕووخانی قودس و گیرانەوەی فوڕات و دەرکەوتنی شاخی ئاڵتونی. پێم وانییە هیچ کەس باسی ئەوە بکات و بیڵێت ئەم نیشانە ماوە، واتە کۆبوونەوەی خەڵک لە جومعەدا جگە لەمونافق یان کافر کەسی تری لێ

نەبێت. بەڵام ئێمە ناتوانین بەگشتی قسەی تێدا بکەین، واتە بڵێین لەئێستا هەموو مزگەوت و ڕۆژەکانی هەینی هیچ موسڵمان و ئیمانداریکی لێ نییە، بەڵام دەڵێین زۆر کەمە، زۆرینەی مزگەوت و ئیمامەکانیش دینیان فرۆشتووە.

بۆیە نوێژ لەدوای هیچ ئیمامێک ناکرێت ئەگەر حیزبی بێت یان بڕوای بە سیستەمی دیموکراسی هەبێت، ئەگەر ڕیشیان لەسەر چۆکیشیان بێت یان لەدوای هیچ ئیمامێک نوێژ ناکرێت کە پشتی طاغوت و ستەمکارانیان گرتووە و بەوەلی ئەمری خەڵک و موسڵمانیان دەزانن چونکە الله عز وجل دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾.

لەکۆتاییدا ئەوەی من بۆم باسکردن هیچ شتێک قسەی خۆم نەبوو، تەنیا نەقڵی شتەکانم کردووە و بەدواداچوونم بۆی کردووە. یا الله ئەوا من گەیاندم تۆش شاهێدبە.

## بەشی شەشەم: ئایا نوێژ دابڕان لەگەڵ ئیمام جائیزە؟

زۆرێک دەپرسن و دەڵێن ئێمە دەچین بۆ مزگەوت چونکە ناچارین بەڵام مەلای مینبەر گومڕایە و دینفرۆشە، هەروەها هەندێک دەپرسن و دەڵێن ئێمە دەچینە حەج یان عەمرە، کەچی عبدالرحمن سودەیس پێش نوێژی دەکات، چی بکەین و چارەمان چییە؟

لەوەڵامی ئەو پرسیارانە ئەو بەسەرهات و نمونەیە باسدەکەین:

جابری کوڕی عبدالله (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: معاذی کوڕی جبل نوێژی لەگەڵ رسول الله (ﷺ) دەکرد. دواتریش دەڕۆیشت و پێش نوێژی بۆ قەومەکەی دەکرد یان پێش نوێژی بۆمان دەکرد. شەوێکیان رسول الله (ﷺ) نوێژی عیشای تەئخیر کرد، معاذ نوێژی لەگەڵدا کرد و دواتریش گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی و نوێژی بۆکردن. لەنوێژەکەیدا بەسورەتی البقره دەستی پێکرد. یەکێک لەوانەی ئامادەبوون، نوێژی لەگەڵیان بڕی و بەتەنیا نوێژەکەی کرد. معاذیش پێی گووت: نیفاقت نواند ئەی فلان. (لەهەندێک ڕیوایەتدا هاتووە کە بە معاذ دەگوترێت: فلان کەس نوێژی دابڕی و جیابووەوە. ئەویش فەرمووی: فلان مونافیقە). ئەویش پێی گووت: نەخێر، مونافیق نیم. ئنجا کابرا چووە لای رسول الله (ﷺ) و پێی گووت: ئەی پێغەمبەری خوا معاذ نوێژ لەگەل تۆدا دەکات و دواتریش دێت پێش نوێژمان بۆ دەکات. ئێمە خاوەنی ووشتر و ماڵاتین و بەدەستەکانی خۆمان کار دەکەین. بەڵام ئەو دێت و سورەتی البقرەمان بۆ دەخوێنێت. رسول الله ڕووی کردە معاذ و پێی فەرموو: ئایا تۆ خەڵک

دوور دەخەیتەوە یان سارد دەکەیتەوە، دوو سێ جار لێی دووبارەکردووە بەتوڕەییەوە[(١)]. الخ...

زانایان ئەم حەدیثە دەکەنە بەڵگەی جائیزبوونی موفارەقە بە (عوذر). لێرەدا رسول الله لۆمەی ئەوکەسەی نەکرد کەوا نوێژەکەی لەگەڵ ئیمام نەکرد و بەتەنیا نوێژی کرد و کورتی کردەوە. دواتر دەچێتە لای پێغەمبەر و عوزرەکەی پێ دەڵێت: بەوەی ئێمە ماندووین و ئەو توانایەمان نییە لەنوێژی درێژ بوەستین.

کەواتە ئەگەر بەهۆی درێژکردنەوەی خوێندنی قورئان لەنوێژدا قبوڵبێت و ڕێگەی پێبدرێت. بێگوومان ئیمام ئەگەر موبتەدیع یان موشریک یان دینفرۆش بێت، بەهەموو پێوەرێکی شەرع ئەولاترە کەوا نوێژی لەدواوە دابڕێنرێت. بۆیە دەتوانرێت لەکاتی حەج یان عەمرە نیەتی فەردی بهێنرێت بەجۆرێک لەکاتی ڕکوع و سجود کەمێک خۆت تەئخیر تر بکەیت بۆئەوەی هەستت پێنەکرێت و لەکاتی سەلام دانەوەشدا کەمێک خۆت تەئخیر بکەیت، والله اعلى واعلم.

عَنْ عَمْرٍو، وَسَمِعَهُ مِنْ جَابِرٍ، قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّنَا - قَالَ مَرَّةً: ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي بِقَوْمِهِ - فَأَخَّرَ النَّبِيُّ (ﷺ) لَيْلَةً

---

(١) ئەم حەدیثە صەحیحە لە بخاری و مسلم و ئەبو داود واردە.

الصَّلاَةَ - وَقَالَ مَرَّةً: الْعِشَاءَ - فَصَلَّى مُعَاذٌ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثُمَّ جَاءَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَقَرَأَ الْبَقَرَةَ، فَاعْتَزَلَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَصَلَّى، فَقِيلَ: نَافَقْتَ يَا فُلاَنُ. فَقَالَ: مَا نَافَقْتُ. فَأَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ مُعَاذًا يُصَلِّي مَعَكَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّنَا يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنَّمَا نَحْنُ أَصْحَابُ نَوَاضِحَ وَنَعْمَلُ بِأَيْدِينَا، وَإِنَّهُ جَاءَ يَؤُمُّنَا فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ. فَقَالَ: "يَا مُعَاذُ، أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ اقْرَأْ بِكَذَا، اقْرَأْ بِكَذَا". قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: بِـ(سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) وَ (اللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى).

**سەرچاوە بەکارهاتووەکان:**

١- تفسير الطبرى.
٢- تفسير إبن كثير.
٣- تفسير البغوى.
٤- تفسير قرطبى.
٥- إبانه الكبرى، إبن بطه العكبرى.
٦- اصول السنه لإمام أحمد بن حنبل الشيبانى.
٧- شرح السنه للمزنى.
٨- اعتقاد سفيان الثورى، أبوالقاسم ألالكائى.
٩- كتاب السنة عبدالله بن أحمد بن محمد بن حنبل الشيبانى.
١٠- خلق الأفعال العباد والرد على الجهميه، محمد بن إسماعيل البخارى.
لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تر...

ئەوەی گرنگە من ئەم باسەم پاڵپشت بە مەنهەج و ئیعتیقادی خیرالقرون نوسیووە و سەرچاوە و کتێبەکانی ئەوانم بەکارهێناوە. داواکارم الله لە هەڵە و کەموکوڕیمان خۆش بێت.